


# ژیانی پێشەوای ئازیزمان

ئامادەکردنی: سالار عومەر

## قۆناغی پێنجەم



بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب

**ناوی کتێب : ژیانی پێشەوای ئازیزمان محمد ﷺ**

**ئامادەکردنی: سالارعمر**

**نەخشەسازی ناوەوە: عبدالله خاکی**

**دیزاینی بەرگ : ڕێدارعومەر**





# بەرهەمی: پرۆژەی ئاگا

## ناونیشانی پرۆژەی ئاگا لە تۆڕە کۆمەلایەتیەکان



Aga project :: پرۆژەی ئاگا



Aga project :: پرۆژەی ئاگا



٠٧٥٠٧١٤٧٠٣٧



٠٧٥٠ ٧١٤٧٠٣٧



@aga_kteb



## کۆچکردنی پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ بۆ مەدینە:

هەر ئەو ڕۆژەی کە پیلانیان دانا لە دارلنەدوە خوای گەورە جبریل(سەلامی خوای گەورەی لێ بێ) ناردە لای پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ و پێی فەرموو ئەو جێگەی کە تێیدا دەنووی لەوێدا مەمێنەوە و بەجێی بهێڵە و کۆچ بکە.

بەم شێوەیە دوای سیانزە ساڵ مانەوە لە مەککە خوای گەورە ڕێگەی بە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دا مەککە جێبهێڵێ و کۆچ بکات.

ئیبن عەبباس دەفەرموێت:- لەم کاتەدا ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە: {وَقُلْ رَبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَلْ لِي مِنْ لَدُنْكَ سُلْطَانًا نَصِيرًا}[1].

واتە: بڵێ: پەروەردگارا یارمەتیم بدە تا هەرکاتێك دەستبەکاری (هەر خێرێك بووم بەچاکی و ڕاستی و دروستی ئەنجامی بدەم و لەهەر کارێك بوومەوە و ئەنجامدا سەرەنجامێکی چاکی هەبێت و بەجوانی لێی دەرچم و هەمیشە و بەردەوام لەلایەن خۆتەوە دەسەلاتێکم پێ ببەخشە کە ببێتە هۆی سەرکەوتنی بەردەوامم.

ئیمامی عەلی(خوای گەورە لێی ڕازی بێ) لە پێغەمبەری خۆشەویستمانەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:- بە جبریلم وت کێ لەگەڵ خۆم بەرم بۆ کۆچکردنەکە؟ جبریل فەرمووی ئەبو بەکر.

پێش چوار مانگ ئەبو بەکر دوو وشتری چاکی ئامادە کردبوو بۆ کۆچکردنەکە

[1] الاسراء (٨٠)

لە گێڕانەوەیەکی دایکە عائیشەدا(خوای گەورە لێی ڕازی بێ)دوای ئەوە لە نیوەڕۆدا پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ ڕۆیشتە ماڵی ئەبو بەکر و پێی فەرموو:-

ئایە زانیووتە ڕێگەم پێدراوە بۆ دەرچوون، ئەبو بەکر فەرمووی من لەگەڵتدام ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟

فەرمووی:- بەڵێ.

لە ڕیوایەتەکەی ئیبنو هیشامدا دایکە عائیشە(خوای گەورە لێی ڕازی بێ) دەفەرموێت: واللّٰەی پێش ئەو ڕۆژە هەرگیز هیچ کاتێک نەمزانیووە کە مرۆڤ لە خۆشیدا بگری، کە بینیم فرمێسک لە چاوی ئەبو بەکر هاتە خوارەوە لە خۆشی هاوەڵدارێتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

دوای ئەوە کاتێک وشترەکەی پێغەمبەری سەروەرمانیان ﷺ ئامادە کرد، ئەسما بە ئەبو بەکری فەرموو واللّٰەی هیچ شتێک گومان نابەم سفرەکەی پێ بپێچمەوە جگەلە ئەم پشتوێنەی کە بە پشتمەوەیە، ئەبو بەکر پێی فەرموو: پشتێنەکە بکە بە دوو کەرتەوە و دانەیەکی دەمی مەشکەکەی پێ ببەستە و ئەوی تر سفرەکە، بۆیە بەهۆی ئەمەوە ئەسما بە(ذات النطاقين) ناسرا، واتا خاوەنی دوو پشتێنەکە.

هەر لەو کاتەوە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ و ئەبو بەکر لەگەڵ پیاوێکی بەنی دەیل ڕێککەوتن، پیاوێکی ڕێگە ناس بوو، هەرچەندە لە بێباوەڕان بوو بەڵام باوەڕ پێکراو بوو.



ڕێککەوتن لەگەڵی دوای سێ ڕۆژ بە هەردوو وشترەکەوە لای ئەشکەوتی (ثور) ئامادە بێ بۆ بردنی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر و کۆچەکە بکەن.

ئیبنو عەبباس (خوای گەورە لێی ڕازی بێ) دەفەرموێت: کە تاریکایی شەو داهات نوێنەرە هەڵبژاردراوەکانی قورەیش کە بۆ کوشتنی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ دانرابوون لە دەوروبەری ماڵی پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ بڵاوبوونەوە بۆ چاودێری کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ.

کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ جێگەکانیانی بینی و هەستی پێ کردن بە عەلی فەرموو: لە جێگاکەی من بخەوە و عەبا سەوزەکەم بدە بەسەر خۆتدا، و مەترسە هیچ شتێک لەوانەوە ناگات بە تۆ کە تۆ پێت خۆش نەبێ.

دایکە عائیشە خوای گەورە لێی ڕازی بێ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە عەلی لە شوێنەکەیدا بخەوێ و تا ئەو شتانەی لەلای بوو بۆی بگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان.

و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەویمی کوڕی ساعیدە لە گێڕانەوەیەکدا دەفەرموێت: هەموو ئەو شتانەی کە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ بوون عەلی لە ماوەی سێ ڕۆژدا هەمووی گێڕایەوە بۆ خاوەنەکانیان.

کە کۆبوونەوە لەبەردەم ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو جەهل بە گاڵتەجاڕییەوە باسی ئەوەی کرد کە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەربارەی باوەڕهێنان و باوەڕنەهێنان دەیفەرموێت، و پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ هاتە دەرەوە و پێشەوا

عەلی لە جێگەی خۆی دانابوو و مشتێ خۆڵی پێ بوو و فەرمووی: بەڵێ من وا دەڵێم و تـــۆش یەکێکـــی لەوانە(ئەوانەی کە دەخـــرێنە دۆزەخەوە، لەبەر ئەوەی لە بێبـاوەڕانە)، لەوێـدا خـوای گەورە چـاوی ئەوانـی کـوێر کـرد و بەهـیچ جۆرێـک پێغەمـبەری سـەروەرمانیان ﷺ نەبینی، و پێغەمـبەری ئەزیزمـان ﷺ خـۆڵەکەی پرژاند بەسەریاندا و ئایەتی نۆی سورەتی "یس"ی خوێند بەسەریاندا.[1]

(وَجَعَلْنَا مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ)[2]

واتە: هەروەهـا بەربەسـتمان لەبەردەمیـانەوە و لەپشـتیانەوە دانـاوە، پەردەشـمان هێناوە بەسەر چاویاندا، ئیتر ئەوانە حەق و ڕاستی نابینن.

کە پێغەمـبەری خۆشـەویسـتمان ﷺ تەواوبـوو لە خوێنـدنەکە هـیچ پیـاوێ نەمـابوو خۆڵ بەسەریدا نەکرابێ.

دواتـر بەڕێ کەوت بەرەو مـاڵی پێشـەوا ئەبـو بەکـر و لە دەرگای پشـتەوەی مـاڵەکەی بەرەو ئەشکەوتی (ثور) بەڕێ کەوتن کە لە شـاخەکەی خـوارەوەی شـاری مەککەدا بوو بە دووری یەک کاتژمێر ڕێگا لە پشتەوەی شاری مەککە.

کاتێـک پێغەمـبەری خۆشـەویسـتمان ﷺ شـاری مەکـکەی پیـرۆزی بەجێ هێشـت فەرمـووی: تـۆ خۆشـەویسـترین وڵاتـی خـوای لەلای مـن، گەر هاوەڵـدانەران منیـان دەرنەکردایە ئەوا دەرناچووم لە ناوتدا.

[1] ژیانی پێغەمبەری خوا لە قورئان و فەرموودەدا
[2] یس (٩)



پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ئەشکەوتی (ثور) و سێ ڕۆژ لەوێ مانەوە، و بە شەوان عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکر لەلایان دەمایەوە و هەر هەواڵێک هەبووایە پێیان دەگەیاند و لە کاتی پارشێو دەگەڕایەوە مەککە و لەگەڵ خەڵکی ڕۆژی دەکردەوە بۆ ئەوەی هیچ هەستی پێ نەکەن.

و عامری کوڕی فوهەیرە هەموو ڕۆژێ پێش خۆر هەڵاتن مەڕەکانی لە شاخەکانی مەککە بڵاو دەکردەوە بۆ ئەوەی بێباوەڕان هەستی پێ نەکەن و پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ و ئەبو بەکر شیریان لێیان دەدۆشی و هەر پێویستییەکیان هەبوایە پێیان درووست دەکرد.[1]

[1] ژیانی پێغەمبەری خوا لە قورئان و فەرموودەدا

## دوای ئەوەی کە قورەیش زانیان پێغەمبەری خوایان ﷺ لە دەست چوو و پیلانەکەیان شکستی هێنا:-

دوای ئەوەی کە ڕۆژ بوویەوە و نوێنەرە هەڵبژێردراوەکانی قورەیش بە ئاگا هاتنەوە و بۆیان دەرکەوت ئەو کەسە عەلییە و پێغەمبەری خوا ﷺ نییە، زۆر تورە بوون و لە ئیمامی عەلییان پرسی کوا هاوەڵەکەت؟

فەرمووی: نازانم.[1]

دواتر لە ئیمامی عەلییان دا و بەندیان کرد بە ئومێدی ئەوەی شتێکیان دەست بکەوێت لە بارەی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ و هاوەڵەکەیەوە.

کە هیچیان دەست ناکەوت ڕۆیشتن بۆ ماڵی پێشەوا ئەبو بەکر و لە ئەسمائی کچیان پرسی کوا باوکت، فەرمووی: سوێند بە خوا نازانم.

ئەبو جەهل کە پیاوێکی دەم پیسی دەست وەشێن بوو، شەپازلەیەکی لێی دا و گوارەکەی گوێی کەوتە خوارەوە.

دوای ئەوە قورەیشییەکان بڕیاریاندا هەموو ئامرازێ بەکار بێنن بۆ گرتنی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ و پێشەوا ئەبو بەکر.

بۆ ئەم مەبەستەش هەر چوار ئەو ڕێگایانەی کە دێن بۆ مەککە خستە ژێر چاودێری زۆر چڕی چەکدارییەوە، و بڕیاریاندا هەر کەسێک هەر یەکێکیان بە

[1] ژیانی پێغەمبەری خوا لە قورئان و فەرموودەدا_



زینـدوویی یـان مردوویـی بـداتە دەسـتی قـوڕەیش ئەوا ١٠٠ وشـتری بە دیـاری پـێ ئەدەن.

دوای ئەم بڕیارانە هەرچی سـوارچاک و چەکدار بـوون بە هەمـوو لایەکدا بڵاوەیـان کـرد بـۆ بینینەوەیـان {سـوراقەی کـوڕی مالیـک ئەم ڕاسـتیەمان بـۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: نوێنەرانی کافرەکانی قـوڕەیش هـاتنە لامان و نـوێنەری تایبەتیـان ناردە لای هەر هۆزێک و هاتە لامان و خەڵاتی گەورەیان دانا بۆ ئەو کەسـەی پێغەمبەر ﷺ و پێشـەوا ئەبـو بەکـر دەسـتگیر بـکەن یـان بیـانکوژن، و لە ڕیـوایەتێکی تـردا دەفەرموێ خەڵاتەکەش سەد وشتربوو بۆ هەر یەکێکیان }[1]، و هاوبەشداران هەتا دەمی ئەشکەوتەکەش ڕۆیشتن، بەڵام نەیانیان بینی.

و لەو کاتەی کە گەیشتنە نزیک ئەشکەوتەکە ئەبو بەکری صدیق بە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموو: خۆ ئەگەر یەکێکیان سەیری خوارەوە بکەن دەمانبینێت.

فەرمووی: بێدەنگبە ئەبو بەکر ئێمە دوانین و سێهەممان خوایە، لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: ئەبو بەکر چی دەڵێیت لە بارەی دووانەوە سێهەمیان خوا بێت.؟[2]

کاتێـک یەکێـک لە پیاوەکان بەرەو ئەشـکەوتەکە هـاتن ئەبـو بەکـر فەرمـووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێستا ئەو پیاوە دەمانبینێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر، فریشتە بە باڵەکانی دەمانپۆشێت.

---

[1] لە کتێبی ژیانی پێغەمبەری خوا لە قورئان و فەرموودەدا_ ل/٢٤٩

[2] گوڵاوی سەرمۆر ١٨٩_١٩٠



ئەو پیاوە ئەوەندەی پێ نەچوو بەرەو ڕووی ئەشکەوتەکە دانیشت و پیسایی کرد، و پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەو ئێمەی ببینیایە ئەوهای نەدەکرد.

بەسەرهاتی دوو کۆتر و جاڵجاڵۆکەکەش بەسەرهاتێکی لاوازە.[١]

---

[١] ژیانی پێغەمبەری خوا لە قورئان و فەرموودەدا ل/ ٢٤٦



## بەڕێ کەوتن لە ئەشکەوتەکەوە بۆ شاری مەدینەی پیرۆز:

کاتێــک کە گەڕان و گەرموگــوڕی بێبــاوەڕان دامرکــایەوە دوای ٣ ڕۆژ لە گەڕانــی بەردەوام، پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکەی ئەبو بەکری صدیق خوای گەورە لێی ڕازی بێ خۆیان ئامادە کرد بۆ دەرچوون بەرەو شاری مەدینە.

لە سـێیەم شـەو ئەو پیـاوە ڕێگەناسـە بێبـاوەڕەی کە نـاوی عەبـدوڵڵا بـوو و لەگەڵی ڕێـک کەوتبـوون گەیشـتە شـوێنی دیـاریکراو و لەگەڵ پێغەمـبەری خـوا ﷺ و ئەبـو بەکری هاوەڵی و عامری کوڕی فهیرە بەڕێ کەوتن و کەناری دەریای پێ گرتنە بەر.

ئەبـو بەکـر دەگێڕێتەوە ئەو شـەوە تـا سـبەی نیـوەڕۆ بەردەوام بـوون لە ڕۆیشـتن، و دواتــر بەردێکــی درێژیــان بینــی و کەمێــک لە ژێــر حەوانەوە و دوای ئەوە بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن.

نەریتی ئەبو بەکر وا بوو لە پشتەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێی دەکرد، لەبەر ئەوەی پیـر دەردەکەوت و پێغەمـبەری سـەروەرمانیش ﷺ گەنـج دەردەکەوت، هەرکەس ئەوانی ببینیایە لە ئەبو بەکریان دەپرسی ئەوە کێیە لەگەڵت، ئەویش دەیفەرموو: ئەو ڕێنوێنی ڕێگەم دەکات.

جا بەو شێوەیە پرسیارکەر وایدەزانی مەبەستی ڕێگەیە، ئەویش مەبەستی ڕێنوێنی ڕێگەی چاکە بوو.

کە لە ڕێگـادا بـوون سـوراقەی کـوڕی مالیـک بە سـواری وڵاخەکەیەوە شـوێنیان کەوت، و پێشەوا ئەبو بەکر فەرمووی:

پێغەمبەری خوا ئەریٚ ئەو ئەسپ سوارە خەریک پێمان دەگات.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خەمبار مەبە الله لەگەڵمانە.

جا لەو ماوەیەدا ئەسپەکەی سوراقە چەندین جار سوراقەی فڕێدایە خوارەوە و سـوراقە کـۆمەڵێ تیری هەبـوو، هەر تیرێـک و شـتێکی لەسـەر نووسـرابوو کە پێی دەوتریٚ ئەزلام، و ئەمەش لە سەردەومی نەفامیدا هەبوو و بە هاتنی ئیسلام خوای گەورە حەرامی کـرد. هەر لە سـەرەتای دەرچـوونی و تـا کۆتـا کەوتنی چەنـدین جـار تیری هەڵبژارد، هەموو جارەکان ئەوەی دەردەچوو سوراقە پێی خۆش نەبوو.

کۆتا جار کە کەوتە خواراوە و تیرێکی هەڵبژارد، ئەنجامەکەی پیٚ خۆش نەبوو، بۆیە هـاواری کـرد پەنـام بـدەن، پێغەمـبەری خۆشـەویسـتمان ﷺ و ئەبـو بەکـری هـاوەڵی وەستان و سوراقەش سواری ئەسپەکەی بوو و ڕۆیشتە لایان.

دوای هەمـوو ئەمـانە سـوراقە گەیشـتە ئەو بـاوەڕەی کە پێغەمـبەری خـوا ﷺ و پەیامەکەی سەردەکەون.

کە پێیان گەیشت باسی هەموو ئەو شتانەی بۆیان کرد کە لە مەککە دەگوزەریٚ.

و نـان و خـۆراکی خسـتە پێشـیان، پێغەمبەری خـوا ﷺ و ئەبـو بەکـری صدیق هـیچ گرنگییەکیـان نەدا و هـیچ پرسـیارێکیان لێی نەکـرد و تەنها پێیـان وت خەڵکیمـان لیٚ



چەواشە بکە، ئەویش داوای نووسراوێکی دڵنیابوونەوەی لێیان کرد، و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە عامری کوڕی فەهیرە بۆی ئامادە بکات.

دوای ئەوە ڕۆیشتن.

و لە ڕێگادا کۆمەڵێ ڕووداوی زۆر ڕوویاندا، یەکێک لەوانە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکانی گەیشتن بە خێوەتگاکەی ئوم مەعبەد و لەوێ لێیان پرسی هیچی لەلایە پێیان بدا، ئوم مەعبەد وتی سوێند بە خوا هەرچیم لەلا بووایە پێتانم دەدا ئەمساڵ وشکە ساڵییە و مەڕەکانم لاوازن، پێغەمبەری خوا ﷺ مەڕێکی لاوازی لە خوارەوەی خێوەتگاکە بینی، فەرمووی:

ئەرێ ئوم مەعبەد ئەو مەڕە چییە؟

ئەویش فەرمووی: لەبەر بێهێزی لە مێگەلەکە جێماوە.

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ پێی فەرموو:

ئەی شیری تێدایە؟

ئەویش فەرمووی:

بە خوا لەوە لاوازترە شیری تێدا بێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:

مۆڵەتم دەدەی بیدۆشم؟

ئەویش فەرمووی: بەڵێ، بە قوربانت بم، ئەگەر شیری تێدا دەبینی بیدۆشە.

پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی خوای گەورەی لێی هێنا و نزای کرد، گوانەکەی پڕ بوو لە شیر و لێی دەچۆڕا.

و داوای دەفرێکی کرد کە کۆمەڵێک تێر بکات و دۆشی و ئەو دەفرەی پڕ کرد، و دوای ئەوە بە ئوم مەعبەدی دا لێی خواردەوە هەتا تێر بوو، و دواتر هاوەڵەکانی ئینجا خۆی، دیسانەوە دەفرەکەی پڕ کردەوە لە شیر و دواتر بە جێیان هێشت.

زۆری پێ نەچوو ئەبو مەعبەد هاتەوە،کە شیرەکەی بینی سەری سوڕما و وتی:

ئەمەت لە کوێ بوو لە کاتێکە مەڕەکە لاوازە و ماڵەکە هیچ شیری تێدا نەبوو؟

ئەویش بەسەرهاتەکەی بۆی باسکرد و بە شێوازێکی زۆر جوان وەسفی پێغەمبەری سەروەرمانی کرد.

و ئەویش وتی: واللّٰهی ئەوە پیاوەکەی ناو قوڕەیشە کە ئەوەیان وتووە لە بارەیەوە و دەیلێن، ئەڵێی بڕۆم لەگەڵی بم، هەر کاتێک بوار هەبوو مەرج بێ شوێنی بکەوم.

پاش ماوەیەک ڕۆژانە بە دەنگێکی بەرز لە دەوروبەری مەککە شیعرێک دەبیسترا کە باسی لەم بەسەرهاتە دەکرد و وەسفی پێغەمبەری خوای دەکرد ﷺ.

ئەسمائی کچی ئەبو بەکر دەفەرمێ:

نەماندەزانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو کوێ ڕۆیشتووە، جنۆکەیەک لە خوارەوەی مەککە پەیدا بوو و ئەو دێڕە شیعرانەی دەوتەوە و خەڵکی بە شوێنیدا دەڕۆیشتن تەنها دەنگەکە بوو و کابرایان نابینی.

و کە گوێمان لەو شیعرە بوو زانیمان بەرەو مەککە ڕۆیشتووە.



و ڕووداوێکی تری ڕێگاکە ئەوە بوو کە ئەبا بورەیدە کە سەرۆکی هۆزێک بوو، بە مەبەستی گرتنی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ و هاوەڵەکانی دەرچوو بوون و بە ئومێدی ئەوەی ببنە خاوەنی خەڵاتەکە.

کە ڕووبەڕووی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بووەوە دەستبەجێ خۆی و حەفتا پیاوی تری موسڵمان بوون.[1]

[1] گوڵاوی سەرمۆر ١٩٠_ ١٩٥

## دابەزین لە قوبائ:-

عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوەیمی کوڕی ساعیدە (خوای گەورە لێی ڕازی بێ) لە چەند کەسێکی نزیکی خۆیەوە دەگێڕێت و دەفەرموێت: وتیان، کاتێک بیستمان پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەککەوە بەڕێ کەوتووە بۆ مەدینە وا هەستمان کرد نزیک بووەتەوە، بۆیە هەموو ڕۆژێ کە نوێژی بەیانیمان دەکرد دەڕۆیشتین چاوەڕێی پێغەمبەری خوامان دەکرد ﷺ، نەدەگەڕاینەوە تا تینی خۆر زۆری بۆمان دەهێنا و ناچار دەگەڕاینەوە ناو ماڵەکانمان لە مەدینە.

ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ نزیکبووەوە لە شاری مەدینە ئێمە گەڕابووینەوە ماڵەکانمان.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: کاتێک خەڵکانی مەدینە گەڕابوونەوە ماڵەکانی خۆیان پیاوێکی جوولەکە چووە سەر قەڵایەک لە قەڵاکانی شاری مەدینە بە دوای چەند وشترێکدا دەگەڕا، لەو کاتەدا چاوی کەوت بە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکانی کە پۆشاکی سپییان لەبەردابوو لە دوورەوە دیار بوون، و بە هەموو هێزی هاواری کرد:

هۆ کۆمەڵانی عەرەب هۆ کۆمەڵانی بەنی قیلە ئەوەی ئێوە چاوەڕێی دەکەن وا گەیشتە ئێرە.



دوای ئەوە موسڵمانان دەستیان دایە چەک و ڕۆیشتن بەرەو حەڕڕە بۆ پێشوازی کردن لە پێغەمبەری ئازیز ﷺ، کە گەیشتن بە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای دەستە ڕاستدا لایدایە لای کوڕانی بەنی عەمڕی کوڕی عەوف لە قوبائدا پێش شاری مەدینە، کە ڕۆژی دووشەممەی مانگی ڕەبیعی یەکەمدا بوو، ئەبو بەکر ناسراو بوو لەلای هەندێ لە خەڵکانی شاری مەدینە، ئەوانیش پێشوازیان لێ دەکرد و پێشەوا ئەبو بەکریش لە هەواڵیانی دەپرسی، و پێغەمبەری خوا ﷺ بەبێ دەنگ دانیشتبوو لەبەر ئەوەی یەکەم جاری بوو بڕواتە شاری مەدینە و زۆربەی خەڵکی شاری مەدینەش ئەویان نەدەناسی و پێشتر چاویان پێ نەکەوتبوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتا لە ژێر سێبەری دار خورمایەک دانیشتبوو سەیری خەڵکانی دەکرد، تا وەهای لێ هات خۆر هاتە سەر پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر هەستا عەباکەی کرد بە سێبەر بۆی، و لەوێدا خەڵکی زانیان ئەوەی سێبەری بۆ کراوە ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ.

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ چواردە شەو لە قوبائـ مایەوە و لەوێ یەکەم مزگەوتیان درووست کرد و پێغەمبەری سەروەرمانیش ﷺ خۆیشی بەژداری کرد لە درووست کردنی، بە شێوەیەک بوو بەردی گەورەی دەگواستەوە و ئەوەندە گەورە بوو پێغەمبەری سەروەرمانی لار دەکردەوە ﷺ، و شوێنەواری تەپوتۆز لەسەر هەندێ شوێنی پێغەمبەری خۆشەویستمانەوە ﷺ دیار بوو.

دوای دەرچوونی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەی پیرۆز پێشەوا عەلی کوڕی ئەبی طاڵیب ٣ ڕۆژ لە مەککە مایەوە بۆ گێڕانەوەی سپاردەکانی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ، دوای گێڕانەوەی سپاردەکان لە ماوەی ئەو ٣ ڕۆژەدا ئەویش بەڕێ کەوت بەرەو مەدینە و بە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ گەیشت لە قوبائ.

و کاتێک کە گەیشتە ئەوێ کاتی هەینی بوو، و پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای کوڕانی بەنی سالمی کوڕی عەوف لایدابوو و لە مزگەوتی ناو شیوەکەی ڕانونائـ یەکەم نوێژی هەینی پێیان کرد.

کاتێک پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ ویستی بچێتە مەدینە سەرەتا نوێنەری نارده لای پیاو ماقوڵانی بەنی نەجاڕی خزمانی خۆی کە دانیشتووی خەڵکی مەدینە بوون.

و ئەوانیش خۆیان ئامادەکرد بە چەکەوە و ڕۆیشتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، و لە نیوەی ڕێگای نێوان قوبائ و مەدینە پێی گەیشتن.

و پێغەمبەری خوا ﷺ لە باخە خورماکانی نێوان قوبائـ و مەدینە لایدا، و لەوێ پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ و کوڕانی بەنی نەجارِ پیاوێکی لادێیان نارده لای خەڵکی ئەنصارِی مەدینە بۆ ئەوەی لە نزیکبوونەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگاداریان بکاتەوە.

بە گەیشتنی ئەو هەواڵە ٥٠٠ کەس لە ئەنصارەکان بە چەکەوە ڕۆیشتن بۆ پێشوازی کردن لە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ.



دوای ئەوە هەواڵ بە هەموو کوچە و کۆڵانێکی مەدینە بڵاوبوویەوە، و تەنانەت منداڵ و خزمەتکارەکانیش بە ناو کۆڵانەکان بڵاو بوونەوەوە و دەیانوت: اللّٰهُ أَكْبَر پێغەمبەری خوا ﷺ هات، پێغەمبەری خوا ﷺ هات.

ئەنەس خوای گەورە لێی ڕازی بێ دەفەرمێت:

ئەو ڕۆژەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە شاری مەدینە هەموو شت ڕووناک بوویەوە، و هیچ ڕۆژێکم نەبینیووە لەو ڕۆژە چاکتر و ڕووناکتر بێ لەو ڕۆژەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ تێیدا گەیشتە شاری مەدینە.

دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ گەیشتە مەدینە پیاوانی ئەنصار کەوتنە دەمەقاڵێ لەسەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کوێ بمێنێتەوە، پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ پێیانی فەرموو: ئەمشەو من لادەدەمە لای کوڕانی بەنی نەجاڕ خاڵۆیانی عەبدولموطەڵیب، بۆ ئەوەی ڕێزیان لێ بگرم بە ڕۆیشتنم بۆ لایان.

چونکە بەنی نەجاڕ ئافرەتێکیان دابوو بە عەبدولموطەڵیبی باپیری پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆیە پێغەمبەری سەروەرمانیش ﷺ بە خاڵۆیانی خۆی دادەنا.

وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن تاکو گەیشتە نزیک ماڵی ئەبو ئەیوب و لەوێ نیشتەوە و هەڵنەسایەوە، پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فەرمووی:

ماڵی کام خزمانم لێرەوە نزیکە؟

ئەبو ئەیوب هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی:

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من نزیکترینماڵم بە تۆ، ئایا کۆپان و کەلوپەلەکانت کۆبکەمەوە و بیبەمە ماڵەوە؟

پێغەمبەری سەروەرمانیش ﷺ فەرمووی: بەڵێ.

و یەکەم قسە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەڵکی مەدینە کردی ئەمە بوو:

ئەی خەڵکان سەلام بەرپا بکەن لە نێوانتاندا و خواردن ببەخشن و سەردانی خزمانتان بکەن و شەوان نوێژ بکەن و خەڵکی خەوتوون، بە سەلامەتی دەڕۆنە بەهەشتەوە.

دواتر پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بە ئەبو ئەیوبی فەرموو:

جێگەی حەوانەمان بۆ ئامادە بکە.

ئەبو ئەیوبیش ڕۆیشت و ئامادەی کرد و بە سەروەری مرۆڤایەتی ﷺ ڕاگەیاند کە جێگەکەیان ئامادەکراوە.

سەروەری مرۆڤایەتی ﷺ بە ئەبو بەکر و هاوەڵانی فەرموو:

لە سایەی بەرەکەتی خوداوە با بڕۆین پشوو بدەین.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕۆژانە لە کەپرێک دەمایەوە کە لە بەردەوام ماڵەکەی ئەبو ئەیوبدا بوو، و بەم شێوەیە مایەوە تا ماوەی ١٢ ڕۆژ و دوای ئەوە فەرمانی کرد بە درووستکردنی مزگەوت.



خەڵکی مەدینە بەم شێوەیە پێشوازییان کرد لە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ، نەوەک وەکو ئەوەی کە دەوترێ ئافرەت و پیاو و گەورە و بچووک بە دەف لێدان و وتنەوەی (طالع البدر العلینا) پێشوازییان لە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ کردووە، ئەو گێڕانەوەی کە باسی ئەمە دەکات گێڕانەوەیەکی لاوازە.

ئیمامی بەیهەقی دەیسەلمێنێت کە (طلع البدر علینا) لە کاتی گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە سێ هەزار چەکدارەوە لە شەڕی تەبوکدا وتراوەتەوە.

و هەروەها ئیبن قەیيم لە "زاد المعاد" دەیسەلمێنێت (ثنیات الوداع) کە لە سروودەکەدا هاتووە لە ڕێگەی شامە نەکە مەدینە.

و لەو ماوەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی ئەبو ئەیوب مایەوە ئەبو ئەیوب و خێزانەکەی ڕێزێکی تەواویان لێ گرت خوای گەورە لێیان ڕازی بێ.[1]

پاش چەند ڕۆژێک لە گەیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مەدینە سەودەی هاوسەری و هەردوو کچەکەی فاطمە و ئوم کەلثوم و ئوسامەی کوڕی زەید و ئوم ئەیمەن گەیشتنە مەدینە، کە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکر هەموویانی هێنابوو بە منداڵەکانی پێشەوا ئەبو بەکریشەوە بە عائیشەشەوە خوای گەورە لە هەموویان ڕازی بێ.

---

[1] ژیانی پێغەمبەری خوا لە قورئان و فەرموودەدا ل/ ٢٦٢_٢٧١

تەنها زەینەبی کچی پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ نەڕۆیشتبوو، لەبەر ئەوەی هاوسەری ئەبی عاص بوو و ئەویش ڕێگەی نەدابوو بڕوات لەگەڵیان، هەتا لە دوای جەنگی بەدر ئەویش کۆچی کرد.[1]

ئەو موسڵمانانەی دیکەش کە هەر کەسەو بەهۆکاری جیاواز نەیتوانی بوو کۆچ بکات ورردە ورردە هەموویان کۆچیان کرد بەرەو مەدینەی پیرۆز، و هەندێکیان ئەوەی هەیبوو لە ماڵ و سامان بە بێباوەڕەکانی مەککەیان دا بۆ ئەوەی ڕێگایان پێ بدەن بەرەو مەدینە کۆچ بکەن، یەکێک لە ئەوانە صوهەیب بوو خوای گەورە لێی ڕازی بێ کە دوای هەوڵدانێکی زۆر و لە کۆتاییدا پێدانی ماڵ و سامان ئینجا بێباوەڕەکان ڕێگەیان پێیدا کۆچ بکات.

و پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لە کاتی نزای قنوت و پاڕانەوەکانیدا داوای لە خوای گەورە دەکرد ئەو موسڵمانە چەوساوانە ڕزگار بکات کە لە ژێر دەستی بێباوەڕەکانی مەککە مابوونەوە.

---

[1] گوڵاوی سەرمۆر_ ل/ ١٩٩



## ژیان لە ناو مەدینە

دەكرێت سەردەمی قۆناغی مەدینە بكەین بە سێ بەشەوە:-

یەكەم// قۆناغێك كە چەند كێشەیەكی تێدا وروژێندرا و لە ناوخۆوە چەندین كۆسپ و تەگەرە دانران و دوژمنان هێرشیان كردە سەر مەدینە، ئەم قۆناغە كۆتایی دێ بە ڕێككەوتنی حودەیبییە لە مانگی ذیلقعدەی ساڵی شەشەمی كۆچی.

دووەم// قۆناغی شەڕ لەگەڵ سەركردایەتی بت پەرستاندا، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی هەشتەمی كۆچیدا كۆتایی دێت بە فەتحی مەككە، ئەمەش قۆناغی بانگەوازی پاشاكانە.

سێیەم// قۆناغی پۆل پۆل موسڵمانبوونی خەڵكی، ئەمەش قۆناغی هاتنی شاندی خێڵ و تیرەكانە بۆ مەدینە، كە بەردەوام دەبێ تا كۆتایی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕەبیعی یەكەمی ساڵی ١١ی كۆچیدا.[١]

---

[١] گوڵاوی سەرمۆر_ل/٢٠٠

## بارودۆخی ئەو کاتەی مەدینە(لە کاتی کۆچدا):

ئەو خەڵکانەی لە شاری مەدینە لەگەڵ پێغەمبەری خوای گەورە ﷺ بوون سێ کۆمەڵە بوون:

یەکەم// موسڵمانەکان، کە ئەمانیش دوو کۆمەڵ بوون:

ئـ. کۆچەرەکان.

ژیان بۆ ئەمان زۆر جیاواز بوو، لەبەر ئەوەی لە مەککە ماڵیان هەبوو و ئیشیان هەبوو و بەڵام هیچ کارێکیان بەدەستەوە نەبوو، هەمووی لە ژێر دەستی دوژمنەکانیان بوو، و لە ماوەی دە ساڵی پێشوو چەوساوە و ژێردەستە بوون و بێباوەڕان بە ئارەزووی خۆیان ئەشکەنجەیانیان دەدا، بەڵام لە مەدینە ڕاستە نە خاوەنی ماڵ و نە خاوەنی ئیش بوون بەڵام هەر لە یەکەم ڕۆژەوە هەموو کارەکان بەدەست خۆیان بوو، و تەواو ئازاد بوون و کەس نەبوو ئەشکەنجەیان بدات و ماندوویان بکات و هەموو بڕیارەکان ڕاستەخۆ بۆ پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ دەگەڕایەوە.

ب. پشتیوانان(ئەنصارەکان).

ئەمان دانیشتووی مەدینە بوون، و ماڵ و ئیشی خۆیان هەبوو، و ئەوەندەیان بەلاوە گرنگ بوو کە پیاو لە ماڵی خۆی بێوەی بێت، و لە نێوان خۆیاندا دووبەرەکی و دوژمنایەتیکی زۆر کۆن و درێژ خایەنیان هەبوو.



و ژمارەی پەنابەران(کۆچەران) ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زۆر زیاتر دەبوون، و مەدینەش بەوە ناسرابوو کە خاوەنی سەروەت و سامانێکی زۆر نەبوو، و کۆچەرانیش تەنها خۆیان هاتبوون بەبێ هیچ شتێک و ئەوەی هەیانبوو بەجێیان هێشتبوو، بۆیە بەم کۆچ کردنەکە هێزی ئابووری شارەکە لاسەنگ بوو، و لەم کاتەشدا هێزە نەیارەکانی ئیسلام نیمچە ئابلۆقەیەکیان خستە سەر مەدینە، بەم شێوەیە باردۆخ خراپتربوو و دەرامەت کەم بووەوە.

بۆیە ژیان تەواو جیاواز بوو و کاتی ئەوە هاتبوو کۆمەڵگایەکی نوێ درووست بکرێ، کۆمەڵگایەکی ئیسلامی بێت.

لە هەموو قۆناغەکانی ژیاندا جیاواز بێت لە ژیانی سەردەمی نەفامی، و تەواو ناوازە بێت.

بەدڵنیاییەوە درووستکردنی کۆمەڵگایەکی لەم شێوازە بە ڕۆژێک نابێت، بەڵکو پێویستی بە کاتێکی درێژ خایەن هەیە.

دووەم/ ئەو هاوەڵدانەرانەی کە هێشتا باوەڕیان نەهێنابوو، ئەمانە لە تیرە و هۆزەکانی مەدینە بوون، و هیچ دوژمنایەتی و رکابەریەتیەکی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ و ئیسلامیان نەدەکرد، هەیانبوو بە دوو دڵی و لە گوماندا دەژیان، سەبارەت بەوەی بەردەوام بن لەسەر ئاینەکەی یان ببێتە موسڵمان.

ئەمانە زۆریان پێنەچوو موسڵمان بوون و مرۆڤی ئاین پەروەریان لێ دەرچوو.

و تێیاندا هەبوو ڕق و کینەیەکی زۆری لە دڵدا بوو بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانان، بەڵام ناچار بوون ئەو ڕق و کینەیە تەنها لە دڵیاندا هەڵبگرن و خۆشەویستی و دڵپاکی خۆیان دەربخەن بە پێی بارودۆخەکە.

لە سەرووی هەموویانەوە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بوو، کە دوای جەنگی بوعاث هەردوو هۆزی ئەوس و خەزرەج ڕێککەوتبوون ئەو بکەنە سەرۆکی هەردوو هۆزەکە، بەڵام زۆری پێنەچوو پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ ڕۆیشتە مەدینە و خێڵەکەی لێی بوونەوە، و ئەویش پێی وابوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ پاشایەتی لێی بردووە، بۆیە لە ناخەوە دژایەتی دەکرد و هەرچی پێ بکرایە دژی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ و موسڵمانان دەیکرد.

سێیەم// جوولەکەکان.

ئەمان لە بنەڕەتدا عیبری بوون، لە کاتی چەوسانەوەی ئاشوری و ڕۆمانیدا لە حیجاز لایاندابوو، و بە تێپەڕبوونی کات لەگەڵ عەرەبەکاندا ژن و ژن خوازیان کرد و کلتووری عەرەب تێکەڵ بە کلتووریان بوو، بەڵام بە ڕەگەز دەمارگیری خۆیان هەر مابوونەوە و تێکەڵ بە عەرەب نەبوون و هەر بە چاوێکی سووک سەیری عەرەبیان دەکرد، و بە نەزان و نەخوێندەوار و وەحشیگەر و دواکەوتوویان دادەنا.

و هەموو شتێکی عەرەبیان بە حەڵاڵی خۆیان دەزانی.



لە شێوازی ئیش و گوزەراندا شارەزابوون و بە ئارەزووی خۆیان یاریان بە بازاڕ دەکرد و سوودیان وەردەگرت لە عەرەبەکان و سوویان دەخوارد و قەرزیان دەدا بە گەورە و پیاو ماقوڵانی عەرەب، دواتر دەڕۆیشتن زەوی و زاریانیان بە بارمتە دەگرت و دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێک دەبووە موڵکی خۆیان.

و جوولەکەکان ئاژاوەچی و شەڕانگێڕ بوون و شەڕی خوێناوییان درووست دەکرد لە نێوان هۆزە عەرەبەکان لە ناو یەثرب(مەدینەدا) سێ هۆزی جوولەکەی بەناوبانگ هەبوون ئەوانیش:

١. بەنو قینقاع، هاوپەیمانی هۆزی خەزرەج بوون و دانیشتووی ناو شاری مەدینە بوون.

٢. بەنو نەضیر.

٣. بەنو قەریظە.

ئەم دووەی کۆتایی هاوپەیمانی هۆزی ئەوس بوون و ماڵەکانیان لە قەراغی شاری مەدینە بوو.

ئەم هۆزانە بوون کە شەڕی نێوان هۆزی ئەوس و خەزرەجیان دەورووژاند، و بە خودی خۆشیان بەشداریان کرد لە جەنگی بوعاثدا، هەریەکە و لەگەڵ هۆزی هاوپەیمانی خۆیاندا.

جوولەکەکان کە زانیان ئیسلام هاتووە و دەیەوێ شاری یەثرب ئارام بکاتەوە و دژی ئەو شتانەیە کە دەکرێت، ترسی ئەوەیان لەلا درووستبوو هەموو ئەو شتانە

لەدەست بدەن کە بە ناڕەوایی بەدەستیان هێناوە، بۆیە ڕق و کینەیەکی زۆریان بەرامبەر ئیسلام و پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ هەبوو بەڵام تا ماوەیەک نەیاندەتوانی ئەو ڕق و کینەیە دەربخەن.[1]

[1] گوڵاوی سەرمۆر لا/ ٢٠٢_٢٠٧



## موسڵمانبوونی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام:

عەبدوڵڵای کوڕی سەلام یەکێک بوو لە پیاوە ناودار و زاناکانی جوولەکە لە ناو مەدینەدا، هەر لەگەڵ بیستنی هەواڵی گەیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی لە کارەکەی هەڵگرت و ڕۆیشتە لای، بۆ ئەوەی بە چاو و گوێی خۆی بۆی دەربکەوێت کە ئەوە پێغەمبەرە یان نا.

کاتێک بە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ گەیشت و لە ناو قەرەباڵغی مەدینە ڕووی پێغەمبەری خوای بینی ﷺ بە تەواوی زانی ئەو ڕوخسارە لە ڕوخساری درۆزن ناچێت.

و عەبدوڵڵا چەن پرسیارێکی لە پێغەمبەری سەروەرمان کرد ﷺ، دوای ئەوەی کە وڵامی دایەوە عەبدوڵڵا شەهادەتی هێنا و موسڵمان بوو.

و دواتر عەبدوڵڵا بە سەروەری مرۆڤایەتیﷺ فەرموو: جوولەکەکان کەسانێکی بوختان چین و باش دەزانن من گەورەیانم و کوڕی زانایانم، تۆ بانگیان بکە و پرسیاریان لێ بکە پێش ئەوەی بزانن من موسڵمان بوومە، چونکە ئەوان گەر بزانن من موسڵمان بوومە شتانێک دەڵێن کە لە مندا بوونی نییە.

پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ ناردی بەشوێن جوولەکەکان و سەبارەت بە عەبدوڵڵای کوڕی سەللام پرسیاری لێیان کرد، ئەوانیش وەسفیان کرد و بە گەورە و زانای خۆیانیان دانا.



بەڵام دوای ئەوەی کە زانیان موسڵمان بووە هەموو قسەکانیان پێچەوانە کردەوە و زۆر بە سووکی باسیان کرد.

عەبدوڵلا وتی: ئا لەوە دەترسام ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە ئەوا وڵامت بدەنەوە.

دوای ئەوە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ پێیانی فەرموو بڕۆنە دەرەوە.[1]

[1] ژیانی پێغەمبەری خوا لە قورئان و فەرموودەدا ٢٧١_٢٧٤



## دروستکردنی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ:

یەکەم هەنگاوی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دروستکردنی مزگەوتەکەی بوو لەو شوێنەی حوشترەکەی چۆکی دادا، و ئەو شوێنەش شوێنی دوو منداڵی بێ باوک بوون بەناوی (سەهل و سوهەیل)[1]، پێغەمبەری خوا ﷺ لێیانی کڕی، و لەو شوێنەدا کۆمەڵێ گۆڕی هاوەڵدانەران هەبوو، پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فەرمانی کرد هەڵبگیرێنەوە و لە شوێنێکی تر بنێژرێنەوە، و کۆمەڵێ کەلاوەی کۆن و دار و درەختی تیابوو هەموویان لابران و مزگەوتەکە لە شوێنیان دروستکرا، و پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ خۆیشی بەشداری لە دروستکردنی کرد و لە کاتی ئیش کردن سروودێکی ئەوتەوە ورەی هاوەڵانی پێ بەرز دەبووەوە، دەیفەرموو: ( اللهم لا عیش الا عیش الاخرة   فاغفر للانصار و المهاجرة).

و هەروەها دەیفەرموو: (هذا الاحمال لاحمال خیبر   هذا أبر ربنا و أطهر).

ئەو کات هێشتا بەیتولمەقدەس (بیت المقدس) قیبلەی موسڵمانان بوو.

هەردوو پایەی مزگەوتەکە لە بەرد دروستکران و دیوارەکانی لە خشت و قوڕ، و سەرەکەشی بە گەڵای دارخورما پۆشرا، ستوونەکانیشی قەدی دارخورما بوون، و زەمینەی مزگەوتەکە لم و چەو بوو، و سێ دەرگای بۆکرا، و درێژییەکەی لە

[1] ژیانی پێغەمبەری خوا لە قورئان و فەرموودەدا

قیبلەگاوە بۆ کۆتاییەکەی سەد باڵ دەبوو، و هەردوولایەکەشی بەو ئەندازەیە یان کەمتربوو، و بناغەکەی نزیکەی سێ باڵ دەبوو.

و لە پەنای مزگەوتەکەوە چەند ماڵێک درووستکران، ئەمانە ژووری هاوسەرەکانی پێغەمبەری سەروەرمان بوو ﷺ، دوای تەواوبوونی ژوورەکان پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی ئەبو ئەیوبەوە گواستییەوە ئەوێ.

مزگەوتەکە تەنها شوێنی نوێژ کردن نەبوو، بەڵکو زانکۆیەک بوو بۆ فێربوون وشارەزا بوونی موسڵمانان لە ئاینەکەیان، و هەروەها سەکۆیەک بوو بۆ بەیەکگەیشتن و یەکتر ناسینی هەموو توخمە جیاوازەکانی هۆزەکان، کە پێشتر دەمارگیری و کێشەی نەفامی دووبەرەکی درووست کردبوو لە نێوانیان .

هەروەها پەرلەمانێک بوو بۆ دەرچوونی بڕیارەکان و ڕاوێژ کردن لە نێوان موسڵمانان و جێبەجێ کردنی بڕیارەکان.

و لەگەڵ ئەوەش ماڵێک بوو بۆ ئەو کۆچەرانەی کە هیچ شوێن و ئیش و کەسێکیان نەبوون و بە تەنها بوون و هیچ شتێکیان لە مەککەوە نەهێنابوو لەگەڵ خۆیان.[1]

---

[1] گوڵاوی سەرمۆر_ ل/ ٢١٠_ ٢١١



مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیە مایەوە بەبێ هیچ گۆڕانکارییەک تاکو سەردەمی خەلافەتی ئیمامی عومەر خوای گەورە لێی ڕازی بێ، لەبەر ئەوەی هەندێ لای کۆن ببوو هەستان بەهەمان کەرەستە و شێوەی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دروستیان کردەوە.

بەڵام لە سەردەمی ئیمامی عوثمان موسڵمانان زۆر بوون و مزگەوت قەرەباڵغ بوو، بۆیە ناچاربوو گەورەی بکاتەوە.

دیوارەکەی بە بەردی نەقاڕی نەخشکراو لەگەڵ قسڵاوەدا دروست کردەوە، لە جیاتی قوڕ بۆ ئەوەی زیاتر بەرگە بگرێ، و کۆڵەکەکانی بە داری ساج دروستکرد کە هەندێ نەخشی تیا کرابوو.

مزگەوتەکەی پێغەمبەری سەرورمان ﷺ مینبەری تێدا نەبوو، بۆیە لە کاتی وتاردانا دەڕۆیشتە سەر قەدی دارخورمایەک کە لە ڕووگە(قیبلە)ی مزگەوتەکە دانرابوو، چەند هاوەڵێک بە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموو:

ئایا مینبەرێکت بۆ دروست بکەین لە ڕۆژی جومعەدا بڕۆیتە سەری تا خەڵکان بتبینن و تۆش دەنگت بگاتە خەڵکان و وتارەکەت ببیستن؟

سەروەری مرۆڤایەتی ﷺ پێیانی فەرموو:

بەڵێ.

ئەوانیش مینبەرێکیان دروست کرد کە سێ پلیکانە بوو، و پێغەمبەری خوا ﷺ دەڕۆیشتە سەری و وتاری دەدا.



کاتێـک یەکەمجـار پێغەمـبەری خۆشەویسـتمان ﷺ ڕۆیشـتە سـەری بـۆ وتـاردان دارەکەی تر کە پێشتر دەڕۆیشتە سەری بۆ وتاردان دەستی کرد بە نوزە نوز کردن و هەموو موسڵمانان ناو مزگەوتەکە گوێیان لێ بوو، پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ دابەزی و باوەشی پێدا کرد و دەستی پێدا هێنا و بێدەنگ بوو.

لە گێڕانەوەیەکـدا پێغەمـبەری ئەزیزمـان ﷺ دەفەرموێـت: گەر باوەشـم پێـدا نەکردایە بەردەوام بوو لە نوزە نوز کردن تا ڕۆژی دوایی.[1]

[1] ژیانی پێغەمبەری خوا لە قورئان و فەرموودەدا ٢٧٨_٢٧٩



## گەورەیی و پیرۆزی مزگەوتی پێغەمبەری خواﷺ:

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێت: (کۆچ و بار ئامادە ناکرێت تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێت، ئەوانیش مزگەوتی حەرام(لەناو شاری مەککە) و مزگەوتەکەی خۆم و مزگەوتی ئەقصا(مزگەوتەکەی بیت المقدس).

مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ پیرۆزە لەبەر ئەوەی مزگەوتی سەروەری کوڕانی ئادەمە و مزگەوتی سید المرسلینە، دیارە لەبەر ئەوەیە بە پلەی دووەم دێت دوای مزگەوتەکەی خوای گەورە کە بە دەستی پێغەمبەر ئیبراهیم(سەلامی خوای گەورەی لەسەر بێ) درووستکراوە.

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ دەفەرموێت: (نوێژێک لە مزگەوتەکەمدا چاکترە لە هەزار نوێژ لە جێگاکانی تردا، تەنها مزگەوتی حەرام نەبێت کە نوێژێک تێیدا چاکترە لە سەد هەزار نوێژ کە لە شوێنەکانی تردا بکرێت(واتا لە مزگەوتەکانی تردا).

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری سەروەرمانﷺ دەفەرموێت: نێوان مینبەر و ماڵەکەم باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت.[1]

---

[1] ژیانی پێغەمبەری خوا لە قورئان و فەرموودەدا ل/٢٨٠_٢٨٢

## سەرەتای بانگدان:-

کاتێک پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ ئارام و جێگیر بوو لە مەدینە کۆچەران و پشتیوانان بە ئاشکرا و بە کۆمەڵ نوێژیان دەکرد، و لەوێ ڕۆژوو و زەکات و سنوورەکانی خوای گەورە فەرز کران و حەڵاڵ و حەرام لێک جیا کرایەوە، لە سەرەتادا موسڵمانان خۆیان بەبێ دەنگ کۆ دەبوونەوە لە کاتی نوێژ کردندا.

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر دڵگراں بوو بۆ بابەتی ئەوەی چۆن خەڵکی کۆ بکەنەوە لە کاتی نوێژ کردندا، بۆیە پێیان وت لە کاتی نوێژکردندا ئاڵایەک هەڵبکەن، و کۆمەڵێکی تر وتیان زوڕنایەک وەکو زوڕناکانی جولەکەکان دابنێن و خەڵکی پێ ئاگادار بکەنەوە، کۆمەڵەیەکی تر وتیان زەنگۆڵەیەک وەکو زەنگۆڵەی گاورەکان دابنێن.

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ هەموویانی ڕەت کردەوە و فەرمووی:

بەڕاستی زۆر باش و پەسەندە بەلامەوە کە نوێژی موسڵمانەکان بەیەکەوە بێت و هەمووانی لێ ئاگادار بکەینەوە، و نیازم وایە لە کاتی نوێژدا پیاوانێک بنێرم بە کۆڵانەکاندا بانگی خەڵکی بکەن بۆ ئامادەبوونیان لە نوێژەکانیان، هەتا نیازم وابوو کە هەندێ لە پیاوان دابنێم لەسەر بەرزاییەکانی مەدینە بۆ ئەوەی موسڵمانان ئاگادار بکەنەوە لە کاتی نوێژەکانیان.



لەو کاتانەدا عەبدوڵڵای کوڕی زەید خەوێک دەبینێت، لە خەوەکەیە پیاوێک دەڕواتە لای دوو پۆشاکی سەوزی پۆشیبوو و زەنگۆڵەیەکی بەدەستەوە بوو، پێی دەڵێ ئەی بەندەی خوا ئەو زەنگۆڵەیەم پێ نافرۆشیت؟

پیاوەکەش پێی دەڵێ: چی کارێکت پێی هەیە؟

پێی دەڵێ بەکاری دەهێنم بۆ ئەوەی خەڵکی پێ ئاگادار بکەینەوە بۆ کاتی نوێژ، ئەویش پێی دەڵێ: ئەی شتێکت پێ بڵێم لەوە چاکتر بێت؟

پێی دەفەرمێ فەرموو بڵێ.

ئەویش دەقی بانگدانی پێ دەڵێت {الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، أشهد أن لا إله إلا الله، أشهد أن لا إله إلا الله، أشهد أن محمدًا رسول الله، أشهد أن محمدًا رسول الله، حي على الصلاة، حي على الصلاة، حي على الفلاح، حي على الفلاح، الله أكبر، الله أكبر، لا إله إلا الله} و دواتر دەڕواتە داوەوە و پێی دەڵێ گەر ویستت قامەت بکەیت بۆ نوێژەکانت بڵێ {الله أكبر الله أكبر، أشهد أن لا إله إلا الله، أشهد أن محمدًا رسول الله، حي على الصلاة، حي على الفلاح، قد قامت الصلاة، قد قامت الصلاة، الله أكبر الله أكبر، لا إله إلا الله}

دوای ئەوە کە بەیانی بە ئاگا دێتەوە دەڕواتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و خەوەکەی بۆ دەگێڕێتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ئەوە خەوێکی ڕاستە إِنْ شَاءَ اللّٰه، هەستە لەگەڵ بیلالدا ئەو دەنگی بەرزترە لە تۆ بۆی بڵێ ئەوەی کە بینیووتە با ئەویش بیکات بە بانگ و بانگی پێبدات.

دوای ئەوەی کە بانگیاندا عومەری کوڕی خەطاب خوای گەورە لێی ڕازی بێ لە ماڵی خۆیدا بوو کە گوێی لێ بوو بە پەلە ڕۆیشتە مزگەوت و بە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ فەرمووی: سوێند بەوەی کە تۆی ناردووە بەڕاستی هەر بەو شێوەیە منیش ئەو خەوەم بینیووە.

پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ فەرمووی: سوپاس بۆ خوای گەورە ئەوە جێگیری کرد.

واتە، خەوەکە جێگیر دەبێت کە دوو هاوەڵی بەڕێز وەکو یەک بینیویانە.

لە گێڕانەوەیەکدا دەوترێت بەیانیانێک بیلال بانگی بەیانی دەدات و هێشتا پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ بە ئاگا نەهاتووە، و لەوێدا بیلال دەفەرمێت:

الصلاة خیر من النوم.

بەم شێوەیە ئەم دێڕەش بۆ بانگی بەیانی زیادکرا.[1]

---

[1] ژیانی پێغەمبەری خوا لە قورئان و فەرموودەدا

## بە براکردنی کۆچەران و پشتیوانان و نووسینی بەڵگەنامەیەکی هاوپەیمانی لە نێوانیان:

دوای بونیاتنانی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ پەیوەندی برایەتی بونیاتنا لە نێوان کۆچەران و پشتیوانان خوای گەورە لێیان ڕازی بێ.

بۆ ئەم مەبەستەش لە ماڵی ئەنەسی کوڕی مالیک کۆ بوونەوە کە ژمارەیان نەوەد کەس دەبوون، نیوەیان کۆچەری و نیوەیان پشتیوانان بوون.

برایەتییەکە بەشێوەیە بوو کە کۆچەران میراتگری پشتیوانان بوون، واتا گەر کەسێک لە پشتیوانان وەفاتی بکردایە جگەلە خزم و کەسانی خۆی برا کۆچەرییەکەشی دەبووە میراتگری.

بەم شێوەیە بەردەوام بوون تاکو لە جەنگی بەدر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: {.....وَأُولُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ.....} [1]

کە میراتگری لەو شێوازەی ڕەتکردەوە و تەنها بە میراتگرتنی نێوان خزم و کەسوکار مایەوە.

برایەتییەکە تەنها کارێکی بە قسە و بێ بناغە نەبوو، بەڵکو پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بە کردەوە چەسپاندبوی لە نێوانیان.

پشتیوانان(ئەنصارەکان) بە پێغەمبەری خوایان فەرموو ﷺ:

[1] الانفال_ ٧٥.

دارخورماکانمان بۆ دابەش بکە لە نێوان ئێمە و براکانمان.

پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ پێیانی فەرموو:

نەخێر.

فەرموویـان: کەواتە یارمەتیمـان بـدەن، و ئـێمەش لە بەروبوومـدا هاوبەشـیتان دەکەین.

ئەوانیش فەرموویان: گوێڕایەڵین.

ئەمەش یەکێکە لە بەڵگەکانی خۆشەویستی و ڕێزلێنـان و خـۆبەختکردن و دڵپـاکی پشتیوانان بەرامبەر کۆچەران.

هەروەهـا پێغەمـبەری ئەزیزمـان ﷺ بەڵگەیەکـی هاوپەیمـانێتی بەسـت لەگەڵ پشـتیوانان، بەنـدەکانی پەیماننـامەکە هەمـوو ڕەفتـار و کـردار و هەسـتە نەفامییەکـان و ڕەوتـی خـێڵگەری ڕەت کـردەوە و بـواری نەهێشـتەوە بـۆ نەریتی نەفامی.

چەند بەندێکی پەیماننامەکە:

١. هەموویان یەک ئوممەتن.

٢. نابێت باوەڕدارێک باوەڕدارێکی تر بکوژێت لەبەر بێباوەڕێک.

٣. نابێت باوەڕدار پشتیوانی بێباوەڕێک بکات لە دژی موسڵمانێک.

٤. لەهەر شـتێکدا جیـاوازبن دەبێـت بگەڕێـنەوە لای خـوای گەورە و پێغەمـبەری خواﷺ .





٥. هەر جولەکەیەک لەسەر موسڵمانان بێت ئەوا پشتیوانی و پێشڕەوێتی دەکەن، و ستەمیان لێ ناکەن و کەسیش گەلەکۆمەکیان لێ ناکات.

و کۆمەڵێ بەندی تر.[١]

[١] گوڵاوی سەرمۆر/ ٢١١_ ٢١٤

## نەخۆشی ناو شاری مەدینە:

لەبەر ئەوەی شاری مەککە ناوچەیەکی شاخاوی بوو و تا ڕادەیەک کەش و هەوای جیاواز بوو لە کەش و هەوای مەدینە، کە شارێکی تەخت بوو و کۆچەران ڕانەهاتبوون لە خۆری زۆر گەرمی مەدینە، و شوێنێک بوو کە چەند نەخۆشییەکی تێدا بڵاوببووەوە بۆیە هاوەڵە کۆچەرەکان تووشی نەخۆشی سەخت بوون کاتێک گەیشتنە ناو شاری مەدینە.

و سەبارەت بەوەی کە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ داوای شیفای کرد لە خوای گەورە چەند باسێک هەیە یەکێک لەوانە ئەم باسەی خوارەوەیە:

لەو هاوەڵانەی کە تووشی نەخۆشی هاتن پێشەوا ئەبو بەکر و بیلال و عامرٍ بوون و کاتێک کە دایکە عائیشە ڕۆیشتە لایان و بینیانی زۆر ماندوون ڕۆیشتە لای پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ و داوای لێی کرد نزایان بۆ بکات و پێغەمبەری سەروەرمانیشﷺ فەرمووی:

خوایە مەدینەمان لەلا خۆشەویست بکە وەکو خۆشەویستی مەککەیان زیاتر و ئاو و هەواکەی سازگار بکە و لە نەخۆشی دووری بخەوە و بەرەکەت بخە کێشانە و پێوانەیەوە و لەرزوتا و ناڕەحەتییەکەی بگوازەرەوە بۆ جحفە(کە دوڵێکی دوور مەدینەیە).



جا بەهۆی ئەو نەخۆشییەوە هاوەڵان لەبەر بێهێزی بە دانیشتنەوە نوێژیان دەکرد، کاتێک پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ بینیانی فەرمووی:

بزانن کە نوێژ کردن بە دانیشتنەوە وەک نیوەی نوێژ کردنە بە پێوە(واتا نیوەی پاداشتەکەی هەیە).

جا موسڵمانەکانیش بۆ ئەوەی ئەو سەروەری و پلەبەرزییە لە دەست نەدەن سەرەڕای زۆری ماندووی و نارەحەتییان ڕاستەوخۆ هەستان و بە پێوە نوێژیان کرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام لە خوای گەورە دەپاڕایەوە بۆ ئەوەی هەموو جۆرە حەوانەوەیەک دابین بکات بۆ هاوەڵانی بەڕێزی لە شاری مەدینە، هەتا پاڕایەوە و فەرمووی:

خوای پەروەردگار بەرەکەت بکەیتە ناو شاری مەدینەوە دوو ئەوەندەی ئەو بەرەکەتەی کە خستووتەتە ناو شاری مەککەوە.[1]

---

[1] ژیانی پێغەمبەری خوا لە قورئان و فەرموودەدا

## گەورەیی و پیرۆزی شاری مەدینە:

سەبارەت بەم بابەتە تەنها چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ باس دەکەین.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:

_هەر کەسێک ئارام بگرێت لەسەر ناڕەحەتییەکانی ناو شاری مەدینە ئەوا لە ڕۆژی دواییدا تکاکاری دەبم.

_و هەروەها ئەو فەرموودەیەی پێشوو کە داوای بەرەکەتی کرد لە خوای گەورە.

_شاری مەدینە حەرام کراوە لە نێوان بەرزاییەکەی عیر تاکو بەرزاییەکەی ثور، هەر کەسێک ئاژاوەیەک بنێتەوە یان ئاژاوەچییەک داڵدە بدات نەفرەتی خوای گەورە و فریشتەکان و خەڵکی لێ بێت.

وخوای گەورە تەوبەیان لێ وەرناگرێت کە ببێتە هۆی پاککردنەوەی گوناهەکانیان.

_ من حەرامم کردووە لە شاری مەدینەدا لە نێوان هەردوو بەرزاییەکەیدا، هیچ کەسێک بۆی نییە خوێنی تێدا بڕێژێ یان چەکی تێدا هەڵبگرێت بۆ کوشتار و کەس بۆی نییە دارێکی لێ بشکێنێت مەگەر بۆ ئاژەڵەکەی بێت.

_ خوای گەورە مەدینەی ناو ناوە بە طاب(واتا پاک و چاک).

و شاری مەدینە دوای شاری مەککە بەڕێزترین شارە لەلای خوای گەورە.



_ڕۆژی دوایی بەرپا نابێت هەتا مەدینە خراپەکارەکانی لە خۆی دوور دەخاتەوە، وەکو کورەیەک کە هەرچی ژەنگە لە ئاسنی دوور دەخاتەوە.

_ لەسەر هەر بەرزاییەک لە بەرزاییەکانی شاری مەدینە فریشتەیەک هەیە بۆ پاراستنی و نەخۆشی طاعون و دەجال ناچنە ناو شاری مەدینە.

## وەرگرتنی بەیعەت لە ئافرەتان:

پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەکو چۆن بەیعەتی لە پیاوان وەرگرت بەهەمان شێوەیەش بەیعەتی لە ئافرەتانیش وەرگرت، بۆ ئەم مەبەستەش کاتێک گەیشتە مەدینە ئافرەتە پشتیوانەکانی لە ماڵێکدا کۆ کردەوە و پێشەوا عومەری کوڕی خەطابی ناردە لایان و ئەویش ڕۆیشتە لایان و هەر لە پشتی دەرگاکەوە بەیعەتی لێیان وەرگرت کە هاوبەش بۆ خوای گەورە بڕیار نەدەن و زینا نەکەن و منداڵ نەکوژن و بوختان نەکەن و گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن.

پاشان پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ فەرمانی پێیان کرد کە لە نوێژی جەژندا هەموو ئافرەتاکان بە ئەوانەشەوە کە نوێژیان لەسەر نییە پێکەوە بڕۆنە ئەوپەڕی مەدینە و ئامادە بن بۆ نوێژی جەژن، و هەر لەوێ پێیانی ڕاگەیاند کە نوێژی هەینیان لەسەر نییە و نەهی کرد لەوەی شوێنی جەنازە بکەون.

پێغەمبەری خوای گەورە ﷺ لە کاتی بەیعەت وەرگرتن لە ئافرەتان ئەمانەشی پێیان فەرمووە:

_شین و شەپۆڕ نەکەن لە کاتی ناخۆشی و مردنی کەسێکیان و خۆیان ڕووت نەکەنەوە وەکو ئەوەی لەسەردەمی نەفامی دەیانکرد.

_ فێڵ لە مێردەکانیان نەکەن.[1]

## لەدایکبوونی یەکەم منداڵی کۆچەرەکان:

دوای گەیشتنی موسڵمانەکان جولەکەکان پڕوپاگەندەی ئەوەیان بڵاوکردەوە گوایە ئەوان جادوویان لە موسڵمانەکان کردووە و چیتر منداڵیان نابێ و بەو شێوەیە زیاد ناکەن و هەر جولەکەکان خۆیان زاڵ و دەسەڵاتدار دەبن.

یەکەم منداڵ کە لەدایکبوو منداڵی برازاکەی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بوو، کە ناوی زوبێری کوڕی عەوام بوو.

دوای گەیشتنی ئەسمائی کچی ئیمامی ئەبو بەکر بۆ مەدینە خوای گەورە لێیان ڕازی بێ کە خێزانی زوبێری کوڕی عەوام بوو پڕوپاگەندەکەی جولەکەکان پووکایەوە، لەبەر ئەوەی ئەسمائ دووگیان بوو و کە گەیشتە مەدینە منداڵەکەی لە دایکبوو و ناویان لێنا عەبدوڵڵا.

و یەکەم منداڵی پشتیوانان کە دوای هاتنی کۆچەران لەدایکبوو نوعمانی کوڕی بەشیر بوو.

---

[1] ژیانی پێغەمبەری خوا لە قورئان و فەرموودەدا



## پەیماننامەیەک لەگەڵ جولەکەکان:-

دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ نێوان موسڵمانانی ڕێکخست پێی وابوو دەبێت نێوانی موسڵمانان و بێباوەڕانیش ڕێک بخات، ئەویش بۆ دابینکردنی ئاسایش و ئاشتی و ئارامی لە شاری مەدینەدا، و بۆ ئەم مەبەستەش هەڵنەستا بە دژایەتی و ڕکابەرێتی و دوورخستنەوەیان بەڵکو یاسای لێبووردنی هێنایە کایەوە، کە پێشتر لە جیهانی نەفامی و دەمارگیری و خۆسەپاندندا باو نەبوو، و پەیماننامەیەکی لەگەڵیان بەست، ئەمانەش چەند بەندێکی پەیماننامەکەن:

_ جولەکەکان و موسڵمانەکان ئاینی خۆیان هەیە.

_ جولەکە خەرجی خۆیان لەسەر خۆیانە و موسڵمانانیش بە هەمان شێوە.

_ هەموویان پشتگیری یەکتر دەکەن دژی هەرکەسێک دژایەتی ئەو پەیماننامەیە بکات.

_ هەموو کەسێکی ستەملێکراو پشتیوانی لێ دەکرێت.

_هیچ قورەیشێک و هاوپەیمانێکیان نابێت لە مەدینەدا پەنا بدرێت.

_ئەم پەیماننامەیە چاوپۆشی ناکات لە ستەمکار و تاوانبار.[1]

---

[1] گوڵاوی سەرمۆر